
دەرمانەکان و چۆنیەتی
بەکارهێنانیان
بۆ فێربوونی ناوو جۆری دەرمانەکان و چۆنیەتی
بەکارهێنانیان بەپێی یاساکانی تەندروستی
نووسیار
بارزان کەریم
WELEDA
Cough Drops
WELEDA
Cough Drops

# پێناسەی پەرتوک

پەرتووك: دەرمـانەكـان و چۆنیەتـی بەكارهێنـانیـان

نووسیار: بارزان كریم كەژەكەیی

بـــابـــەت: زانیاری پزیشكی و دەرمانی

ســـاڵی چاپ: دووەم ٢٠١٣

دیزانین: كۆمپیوتەری خانەی چاپەمەنی سۆران

نـــرخی: ٤,٥٠٠ دینار

تیـــراژ: ١٠٠٠

ژمارەی سپاردن: بەڕێوبەرایەتی گشتی كتێبخانەكان ژمارەی سپاردنی ( ٣٣٩ ) ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە

# پێشکەشە:

🖉 بە هەموو ئەو کەسانەی کە بە گیانێکی مرۆڤ دۆستانە یارمەتی مرۆڤەکان دەدەن.

🖉 بە هەموو ئەو خوێنەرە بەڕێزانەی کە عاشقی خوێندنەوەن.

🖉 بەو کەسانەی کە یارمەتیدەر بوون لەئامادەکردنی ئەم کتێبە.

# ناوەرۆک

## پێشەکی:

سەرەتا دەستخۆشی لە کاك بارزان دەکەم کە هەوڵێکی زۆری داوە بە چەکەرەبوونی بەرهەمێك بە شێوەی نامیلکە بۆ ئەوەی بگاتە دەستی هەموو خوێنەرێکی کورد تا شارەزایەکیان هەبێ لە سەر سوودو زیانەکانی چەند جۆرە دەرمانێك بەتایبەتی ئەو دەرمانانەی کە ئاسایی‌و سادەن کە بەشێوەیەکی زۆر بەکاردێت بەڵام سەرباری ئەم هەوڵەش هەندێك کەم‌وکوڕی تیایە چونکە ئەم دەرمانانەی هەڵی بژاردووە بە پێی پیتەکانی ئەبجەدیە بەڵام هەندێك جۆری بەژمارەکی کەم بەکارهێناوە بۆیە پێویست بوو ژمارەی دەرمانەکان زیاتر بوایە وە سوودو زیانەکەی بەشێوەی روونتر دیار بکردایە. ڕەنگە هەڵەی پیتی تێدا بێ بەتایبەتی ناوە ئینگلیزیەکان ئەمەش پێویستی بە فەرهەنگی دەرمانی ئینگلیزیەو پێویست بوو ناوی دەرمانەکان بوایە نەك زانستی، وە ناوی بازرگانیش بەکاربهاتبایە بۆ ئەوەی خەڵکی سادەش شارەزای لەم دەرمانانە هەبێ بەڵام سەرباری ئەممانەش ئەو ئەرك‌و ماندووبونەی کە کاك بارزان کێشاویەتی دووبارە دەست خۆشی لێدەکەم کارێکی جوانی کردووە چونکە زانستی پەرتووك‌و نامیلکەی کوردی لەسەر داودەرمان زۆر کەمە بۆیە ئێمەش هیواخوازین کە ببێتە هەوێنێك بۆ پڕکردنەوەی کەلێنێك لە زانستی دەرمان بە کوردی دووبارە دەست خۆشی لێدەکەم.

د.مەقسود ئیسماعیل

# چەند ووتەیەک:

بێ گومان خودای گەورە ژیانو زەوی دروست کردووە تا مرۆڤ تیایدا بژی، گومانیش لەوەدانییە کە مرۆڤ پێویستی بەتەندروستی هەیە، تەندروستی هۆکارێکی سەرەکیو گرنگە بۆ ژیان. گەر مرۆڤ تەندروست نەبێت جا چ لە لایەنی خۆراکی یان ژینکە یان دەرونی یان کۆمەڵایەتی و جەستەیی یان لەبارەی بوونی نەخۆشی ئەوە کاریگەرییەکی خراپو ئەنجامێکی چاوەڕوان نەکراوی لێ دروست دەبێت.

پێویستە هەموو لایەك گرنگی بە تەندروستی بدەینو زیاتر بەرەو پێشتری ببەین، وە هاوڵاتییان ئاگادار بکەینەوەو زانیاری زیاتریان پێ ببەخشین لەڕێگاکانی کۆڕو سمینارو ووشیارکردنەوەو دەرچوونی تیمی تەندروستیو دەرکردنی پەرتوكو گۆڤارو ڕۆژنامە یاخود لەڕێگەی ڕاگەیاندنەکان بەگشتی. خوێنەری خۆشەویست، کارمەندی تەندروستی ئازیز، ئەم نامیلکەیەی لەبەردەستتە پێك هاتووە لە زانیاری لەسەر دەرمان بەشێوەی بەکارهێنانو بەکارنەهێنانییان وەچۆنییەتی دروست کردنیانو بوونیان، کە چەند شێوەیەك لەخۆ دەگرێ، زیاتر باس لەم دەرمانانە دەکات کە

سـەرەکین‌و زۆر پێویـستن بەتایبـەت لـە نەخۆشـخانەو بنکـە تەندروستییەکان، دەرمانەکان بەشێوەی ڕیزبەندی پیت ڕیزکراون‌و زیاتر لە (٣٦٠) جۆری دەرمان لەخۆ دەگرێ، دەرمانەکان بەهەردوو نـاوی زانستیی‌و بازرگـانی نووسراونەتەوە. لەپاش هـەوڵ‌و مانـدوو بـوونێکی زۆر ویستم لـە ڕێگـەی ئـەم نوسـینە خزمـەت بـەبواری تەندروستی‌و ئێـوەی خۆشەویـست بکـەم، لـەم پەڕتوکـە پـشتم بەستووە بە ڕاچێتی ناو دەرمانەکان، لەگەڵ وەرگێڕانی پـەرتووکی (الصیدلیة والعلم الأدویة) بۆزمانی شیرینی کوردی.

لەکۆتایدا هیـوادارم کارمەنـدو پیشەوەرانی تەندروستی‌و خوێنـەری بەڕێز سوود لەم نامیلکەیەم وەر بگرن وە ڕۆڵێکی سـەرەکی هـەبێت بەتاییبـەتی بـۆ ئـەو قوتابییـە خۆشەویستانەی کـە لـە کۆلێـژو پـەیمانگاکان دەخـوێنن یـا ئەوانـە کـەتازە دادەمـەزرێن‌و ئـەیاوێ زانیاری بواری تەندروستی بەرەو پێش بچێت..

**نووسیار**

**بارزان کریم کەژەکەیی**

# پۆلینکردنی دەرمان

بەشێوەیەکی گشتی دەرمانەکانی ناو ئەم پەرتووکە پێکهاتووە لەم بابەتانەی خوارەوە:-

١_ حەب
٢_ کەپسول
٣_ ئەمپول
٤_ ڤیال
٥_ شرۆب
٦_ دڵۆپ
٧_ کرێم
٨_ مرهم
٩_ فتیل
١٠_ بەخاخ
١١_ پاککەرەوە
١٢_ گیراوە
١٣_ جەلی
١٤_ دەرزی
١٥_ تۆز
١٦ - بۆن

# ڕێگاکانی وەرگرتنی دەرمان:

دەرمان بەچەند ڕێیەکی جۆراوجۆرەوە دەدرێت بە نەخۆشەکان، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی هەمیشە بەم چەند شێوەی خوارەوە دەبێت:

١_ لەڕێی دەم ORAL

٢_ لەڕێی پێست SCIN LOCAL USE

٣_ لەژێر زمان SUBLINGUAL

٤_ لەڕێی کۆم RECTAL

٥_ لەڕێی هەڵمژین INHALATION

٦_ لەڕێی پەردەی لینجی MUCOUS

٧_ لەڕێگای دەرزی INJECTION

# جۆروشێوەکانی دەرزی لێدان:

دەرزی لێدانیش بە دەوری خۆی بەپێی شێوەو جۆری لێدانیەوە بۆ چەند جۆرێك دابەشدەکرێت واتە بەچەند جۆرە شێوەیەك لە نەخۆش دەدرێت لەوانە وەك لەخوارەوە دیارە:

١_ لە ژێر پێست Subcutaneos S.C

٢_ لە پێست Intra Dermal I.D

٣_ لە ماسولکە Intra Muscular I.M

٤_ لە دەمار Intra Venous I.V

٥_ لە درکە مووخ (پەتك) Intra Spinal

٦_ لە سکۆلەکانی دڵ Intra cardial

٧_ لە جومگە Intra Orticular

٨_ لە ئێسك Intra Osseaus

# ژەمەكانی دەرمان و چۆنییەتی پێدانی بە منداڵ:

1) FRIEDS AND CLARK FORMULA

١_ لە ڕێگای فرایدزو كلارگ

ئەمەش بەم شێوەیە دەبێت:

ژەمی منداڵ = كێشی منداڵ بە پاوەند

÷ ١٥٠ × ژەمی كەسێكی پێگەیشتوو

2) YOUNG SRULE

٢_ لە ڕێگای یونج

ئەمەش بەم شێوەیە دەبێت:

ژەمی منداڵ = تەمەنی منداڵ بەساڵ ÷

تەمەنی منداڵ بەساڵ + ١٢ × ژەمی

كەسێكی پێگەیشتوو

## تێبینی :-

١-دەستەواژەی (*بەکاردەهێنرێت*) بریتیە لە هەریەکە لە کاریگەریەکان و باشییەکانی دەرمانی ناوبراو.

٢ دەستەواژەی (*بەکارناهێنرێت*) هەریەکە لە کاریگەریەکان و خراپیەکانی دەرمانی ناوبراو لەخۆ دەگرێ.

٣- دەرمانەکان بە پێی ڕیزبەندی پیتی یەك لە دوای یەك ڕیز کراون کە بە A دەست پێدەکات وە بە Z کۆتایی دێت.

# ناوی هەندێک لە دەرمانەکان و چۆنییەتی بەکارهێنانییان بە پێی ڕیزبەندی پیتەکان

# A

1) Acefyllin Piprazine - Epicophillin Syrub:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ ڕەبۆ، تەنگەنەفەسی، هەوکردنی بۆڕی سینگ، چوونە ژوورەوەی هەوا بۆ ناو سینگ.

- بەکارناهێنرێت/

لە کاتی ڕشانەوەو هەڵێنج، نەخۆشی دڵ، جگەر، برین، لە کاتی سك پڕیو شیردەر.

2) Acetozalamide-Diamox Tab-Cap-Ampul 125-150-500 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ گلوکۆما، گەشکە، پەك کەوتنی دڵ ، کۆبوونـەوەی ئـاو لـە لـەش ئاوتێزان، میزکردن،.....

**بەکارناهێنرێت لە/**

هەسـتیاری بـەخۆی، نەخۆشـی جگـەرو کلیـەکان، نەخۆشـیەکانی کۆئەندامی هەناسە.

3) Acenocumarol:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ خوێن مەیین بەکاردێت.

4) Acetic acid  Gel %0.92:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنو هەستیاری زێ.

## 5) Aceylsalicylic Asid Aspirin Tab-Supp-Veal 60-100-300-500-650 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ سەر ئێشە، تا، ئازارو سوتانەوەو بەرکەوتنی جومگەکان، ددان ئێشە، ژانی ئێسك، ئازاری دەروونی، هەندێك جار لەکاتی ئەنفلەوەنزا بەکاردێت.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

هەستیاری بەخۆی، نارێکی کۆئەندامی هەرس، برینی گەدەو دوانزەگرێ، خوێنبەربوون هیمۆفیلیا، بێ هۆشی، دڵەکزێ، بەردەوامبوون بە مەی، تەمەنی لە ١ ساڵ کەمتر، زگ پڕ، شیردەر.

## 6) Acydovin Oint:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ڤایرۆس، بۆ تامیسکەو ووردە برین.

7) Actifed-Trioprolidine+ Pseudephedrine Tab-Syrubb 25-100-500 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنی جیوبی کەپوو، هەوکردنی بۆڕی نێوان قورگو گوێ، سووربوونەوەو گیرانی لووت، هەستیاری لووت، کۆخە

- **بەکارناهێنرێت لە/**

ئارەق خۆر، ئیشی گەورە

8) Actipar -Triprolidine Hydrochloride + Psedoepherine Syrub:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ سووربوونەوەو هەستیاریو سیلانی لووت، هەستیای بەشی سەرەوەی کۆئەندامی هەناسە قورگ، بۆ بەرزی پاڵەپەستۆی خوێن، بۆ نەخۆشی دڵ، شەکرە، ڕەبۆ، گەورەبوونی پرۆستات.

9) Acyclovir - Zovirax Tab-Syrub-Veal-Solution-Oint 200-250-400-800 Mg-1G:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ دژە ڤایرۆس، تا هەوکردنی پێستو قلیشان لەشوێنە سادەکان ئاساییەکان، پەردەکانی کەپوو، هەوکردنی (جدري ماء) میرکوتە.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

هەستیاری بەخۆی، نەخۆشیەکانی جگەرو کلیەکان، ناتەواوی گەدە، ووشك بوونەوە.

10) Acetazolamide Drop:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ نەخۆشیەکانی چاو گلوکۆم ئاوی ڕەشی چاو، گرژبوون، زیادکردنی چالاکی میز، نەخۆشی درێژبوون.

11) Adrinalin Ampul:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ خوێن بەربوونی لووت، هەستیاری.

## 12) Alfacalcidoh Vitamin D Drop:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ئەو نەخۆشیانەی بەهۆی کەمی کالیسیۆم ڕوو دەدەن.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

ئێسکەنەرمە، کەمی پۆتاسیۆم لەمندالآن.

## 13) Allbendazole - Zentel Tab-Syrub 200-400 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری کرم لە کۆئەندامی هەرس بۆ مندالآنیش بەکاردێت.

- **بەکارناهێنرێت/**

بۆ زگ پڕی.

## 14) Allospasmen - Hematropine + Methylebromid Tab

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ئازارو ڕەقبوونی سکو گەدە، بۆ ژانی زراو، ژانی گورچیلە.

## 15) Alrheumat-Ketoprofen Cap 50 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنو ڕۆماتیزمو ژانی ئێسکو پەیکەرە ماسولکە.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

نەخۆشی گورچیلە، برینی گەدە.

## 16) Aluminium Hydroxide Tab 500 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ دڵە کزێ بەخواردنو دوای نان خواردن، کولکی گەدە.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

قەبزی، لەگەڵ تتراسایکلین.

## 17) Amiloride HCL+Hydrochlorthiazine Tab:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری پاڵەپەستۆی خوێن، پەك کەوتنی دڵ، ئۆدیما، بەکاردێ لەکاتی کەم بوونی ڕێژەی پۆتاسیۆم.

18) Aminophyline - Theophlline Tab-yrub-Ampul-Supp 100-200-250-500 Mg:

- **بەكاردەهێنرێت/**

بۆ هەوكردنی ڕەبۆی درێژخایەن، تەنگەنەفەسی ئەگەرخیزەی لەگەڵ بێت، ڕاگرتنی گرژبوونی بۆڕیەكانی هەواو ڕەق بونیان، هەوكردنی كۆئەندامی هەناسە، سنگە كوژێ، بۆ چارەسەری هێواشی لێدانی دڵ، بۆ ئاوتێزانی سییەكانو دڵو كلیەكان، ڕەبۆی دڵ.

- **بەكارناهێنرێت لە /**

ڕشانەوە، ژەهراوی بوون، منداڵ، لەگەڵ ئەرسرۆمایسینو فینۆباربیتۆن. زگ پڕی، شیردەر، گەشكە، خروشانو هەوكردنی ڕێكەو سەرووی قۆلۆن، شەكرە، نارێكی موولوولەكانی خوێن، نەخۆشی جگەرو كلیەكان، بەرزی پاڵەپەستۆی خوێن.

19) Antazolin - Antistiue ing:

- **بەكاردەهێنرێت/**

بۆ برینی گەدەو دوانزەگرێ، سووتانەوەی گەدە، ترشانی گەدە.

## 20) Amoxicillin Tab-Cap-Syrub-Veal 125-250-500 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ درمە بەکتریای کۆئەندامی هەناسە، درمە بەکتریای کۆئەندامی میز بەتایبەت لەئافرەتی زگ پڕدا، بۆ هەوکردنەکانی بۆڕیەکانی سنگ، ئەنفلەوەنزا، قوڕگ، لەوزەتێن، گوێی ناوەڕاست، میزڵدان، گورچیلە، بۆڕی میز، حەوزیٚ گورچیلە، میزەڕۆ، بۆ سیلان، هەوکردنی پێست، هەوکردنی پەردەکانی مێشك، نەخۆشی زەرداو.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

هەستیاری بەخۆی.

## 21) Asparaginase Ampul + Veal 10000 Iu:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ شێرپەنجەی لۆکیمیا، لیمفاوی توند.

22) Amoxiclav Amoxil+Clavulanic Tab 625 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ جیوبی کەپوو (گیرفانەکان)، هەوکردنەکانی گوێی ناوەڕاست، ئالوەکان، بۆڕی هەناسە، پێست، ئێسك، زمان، مەمك، جۆگەی زەرداوو زەرداو، پاش نەشتەرگەری، سیلانی زاوزێی ئافرەت.

- **بەکارناهێنرێت لە /**

نەخۆشی کێش لە ٤٠ کیلۆ گرام کەمتر.

23) Ampicillin Cap-Syrub-Veal 125-250-500 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ دژە بەکتریا، هەوکردنی لەش بەهۆی بەکتریایی (G-.G+)، بۆ هەوکردنی کۆئەندامی میزو زاوزێو هەناسەو هەرس.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

هەستیاری بە پەنسلینات، نارێکی کۆئەندامی هەرس، کەم خوێنی، شۆك، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، خێرایی لێدانەکانی دڵ، منداڵ.

## 24) Ampiclox -Ampicillin+Cloxacillin Cap-Veal:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنەکانی گەروو، لووت، گورچیلە، گەدە، ریخۆڵەکان، زەرداو، برین، قورگ، هەوکردنەکان بەگشتی بەهۆی بەکتریا.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

لە کاتی هەبوونی هەستیاری بە ئەمپیسیلین و کلۆکاسیلین.

## 25) Amuretic-Hydrochlorothiazine+ Amilloride Tab:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ بەرز بوونەوەی پەستانی خوێن، بۆ کۆبوونەوەی ئاو لەسک دا، بەمۆم بوونی جگەر، پەك کەوتنی دڵ.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

زگپڕی، ناتەواوی گورچیلە، شیردەر، زۆربونی رێژەی کالیسیۆمی خوێن.

26) Anovlar Ethinyleostradiol+Norestrone Tab:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ رێگەگرتن لە سك پڕی.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

شیرپەنجەی مەمك، پەك کەوتنی جگەر، زەرتك، شیرپەنجەی زێ، نەخۆشی کۆئەندامی سوڕان، ڕەبۆ، گەشکە.

27) Arpha-Carbinoxamine Malate+Parol Cap:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەستیاری لووت، جیوبی کەپوو.

28) Artan - Benzhexol Tab-Cap-Syrub 2-5 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ نەخۆشی سەرع (گەشکە)و نارێکیەکانی.

- **بەکارناهێنرێت لە /**

هەستیاری بەخۆی، نەخۆشی پارکنسونزم.

29) Aspegic-Aspirin+Lysineasetylsalylate+ Glycine Veal:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ ئازاری زۆر، تایی ڕۆماتیزمی.

30) Ascorbic Acid-Vitamin C Tab 50-250-500 Mg-1G:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ چارەسەری و خۆپاراستن لە ئەسکەربووت، لەگەڵ خەپڵەی ئاسن مژین لەڕیخۆڵە ئاسان دەکات.

- بەکارناهێنرێت لە/

زگ پڕی، شیرەخۆر، شیردەر.

31) Atropin Sulphate Ampul- Supp 50-100 Mg:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ چارەسەری زگ چوون، ژانی زگ، بۆ ئازار لە منداڵدان و زێ.

32) Atenolol-Tenormin Tab-ampul 25-50-100 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ بەرز بوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن، سنگە کوژێ، خاو بوونەوەی ماسولکەکانی دڵ.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

کەمی لێدانەکانی دڵ، شۆکی دڵ، نارێکی دڵ، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن.

33) Atropine:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری و فراوان کردنی ڕێڕەوەکانی هەرس و ڕێڕەوەکانی ڕژێنی زراو، بۆ پاڵاوتنی گورچیلەکان، ئازار لەکاتی بێ نوێژی.

34) Auralgan-Phenazone+Benazocaine+Glycerin Drop:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنی گوێی ناوەوە، هەوکردنی چاوو کەم کردنەوەی ئازار، لابردنی دەرداوی زەردی ناو گوێ.

## 35) Azelastine Hcl-Allergodil Drop %0.1 Spray:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەستیاری لووت.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

منداڵان، زگ پڕی، تێك چوونی لووت.

.

.

.

# B

## 36) Barbiturates Tab-Ampul :

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ خەو، بۆ نەخۆشی صرع، لەگەڵ بەنجی گشتی بەکاردێت پێش نەشتەرگەری کورت (مهدیء)، لەباری پزیشکی نەفسی، هێمن کەرەوە لەکاتی جودابونەوەی منداڵ.

- **بەکارناهێنرێت/**

بۆ ماوەی درێژ.

## 37) Barkalox Tab -Syrub 400-425 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ زۆری ترشەڵۆك، ژانو غازاتو سووتانەوەی گەدە، برینی گەدە دوانزە گرێ کەئازارێکی زۆری هەبێت یارمەتی دەرەو چارەسەرە.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

زیاتر لە ١٦ دانەحەب، ناتەواوی کلیەکان.

## 38) Beclomethasone - Beconase Drop:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەستیاری لووت، تایی بەرز.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

مندالّی لە ٦ سالّ کەمتر، زگ پڕی.

## 39) Beco ing:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ بێ هێزی لەش (مقوی)، بێ تاقەتی‌و لاوازی.

## 40) Belladenal-Belladona+Phenobarbitone Tab:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ڕەق بوونی گەدەو دوانزەگرێ، ژانی زەرداو، ژانی گەدە، زیاد بوونی ترشەلۆك، ئازاری سوڕی مانگانە.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

گەورەبوونی پڕۆستات، گلوکۆما.

41) Benzathine Panicilline Veal 600000-1200000 Iu:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ دژەنەخۆشی المنهوکین، نەخۆشی دڵ، ڕۆماتیزمی، سیلانی توند، سێفلیس.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

هەستیاری بە پەنسلینات، نارێکی کۆئەندامی هەرس، کەم خوێنی، شۆك، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، خێرایی لێدانەکانی دڵ، منداڵ.

42) Benoxeide Gel:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ لابردنی زیپکەو پەڵەی ڕوخسار.

43) Bufexamic-Droxaryl Cream %5:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنی پێست، خوێن بەربوون، سوڕانی پەلەکان.

## 44) Benzoyl Peroxid Gel %5-10:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ زیپکەی دەمو چاو (حب الشباب).

- **بەکارناهێنرێت لە/**

مندالّ، چاو.

## 45) Benzyl Benzoat – Domizyle:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ گرِوویەتی، ئەسپێی سەرو لەش‌و سەرمیزلّدان.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

چاوو سەر.

## 46) Butamicate Citrate Syrub:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری کۆخە، پاش نەشتەرگەری، پێش پشکنینی بۆری هەوا Scopy، بۆ ژانی زگ پڕ لەسێ مانگی یەکەم.

## 47) Betacort Charonotart-Betamethasone+Sodium Phosphate Ampul:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ بەرکەوتنی ئێسكو ماسولكە، هەوكردنەکانی جومگەی ڕۆماتیزمی، جگەر، گورچیلە، لووت بەهۆی هەستیاری، کیسی زلالی، برینی قۆلۆن، دەمار بەدیارکەوتنیان لەسەر پێست، جومگەکان لەکاتی لێکردنەوەی بەشێك لە ئێسك، ژانی خوارەوەی پشت، ڕەبۆ، هەستیاری، کاتی بزمار لەپێ چوون، ژانی پاژنەپێ، ڕەق بوونی پێستو سوور بوونەوەی، لۆکیمیای منداڵان، گرێی لیمفاوی، ئەکزیما، گرویەتی دەردە ڕێوی.

## 48) Bisolvon Tab-Syrub-Ampul 4-8 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنی بۆڕیەکانی هەوا، هەوکردنی درێژخایەنی سییەکان، گرژبوونی بۆڕیەکانی هەوا، لەکاتی ڕەبۆ بۆ لابردنی ئیفرازاتی نائاسایی، سیلی سی.

49) Betamethasone-Oradexon Tab-Ampul-Syrub-Oint 0.5-1.5 Mg- %0.1:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ دروست کردنی بەرگری لەش، نەخۆشیو هەوکردنی ئێسك، نەخۆشیەکانی پێستو کەروو پەڵە، پێوەدانی مێشوولە، لەکاتی بەکارهێنانی ماددکانی کشتوکاڵی، ڕۆماتیزمی، ژانی ماسولکە، نەخۆشی کوێرە ڕژێنەکان، هەوکردنو ژانی چاو، ڕەبۆ، هەوکردنی گەدەو قۆلۆنو ڕیخۆڵەو جگەر، نەخۆشی دڵ، هەوکردنی قورگ، سیل، کەم بوونی پەرەکانی خوێن، زیاد بوونی ڕێژەی گلوبیولین لەخوێن، ئەکزیما، سووربونەوەو هەستیاری پێست.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

کاتی سیلی پێست، میرکوتە، هەستیاری بەخۆی.

50) Bleomycin Ampul 15 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ شێرپەنجەی لیمفەکان، گرێیە شێرپەنجەیەکان.

## 51) Bisacodyl -Dulcolax Tab-Supp-Solution 2.5-5-10-10.5 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ قەبزی درێژخایەن، بۆ ئامادەکاری پێش نەشتەرگەری لەدایک بوون، لەکاتی پشکنینی ڕیخۆڵەکان بەنازوور، هەندێك جار بۆ قۆلۆن، لەکاتی پشکنینی باریۆم بەکاردەهێنرێت.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

ئازاری سك، هەڵێنج، ڕشانەوە، نەشتەرگەری سك، هەوکردنی ڕیخۆڵەکوێرە.

## 52) Bisolvan-Solvdin-Masillia–Mellrosam Benylin +Pectolyn+Polaramine+Hitalix Syrub:

- **بەکاردەهێنرێت/**

ئەو شرووبانە بۆ کۆخەی تەڕ بەکاردێن.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

کۆخی ووشك.

## 53) Bromocriptine-Lactodel Tab:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ نەزۆکی‌و پیتاندنی هێلکە، بۆ ژان‌و نەخۆشیەکانی مەمك، بۆ کەمی (الحیوانات المنویە) لەپیاوان، کەمی ئارەزوی سێکسی‌و لاوازی‌و کورتی ئەندامی زاوزێی پیاو، کەم کردنەوەی وەرەم گریّ بۆ ئەوەی لێبکرێتەوە، نەخۆشی پارکستۆن، ووشك کردنی شیری مەمك، نەخۆشی سوك لەمەمك.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

بەرزی پاڵەپەستۆی خوێن، هەستیاری، ژەهراوی بوونی زگ پڕ.

## 54) Bromohexine -Bisovlan Syrub-ing 4-8 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنەکانی بۆڕیەکانی سینگ، سییەکان، کەم کردنەوەی بەڵغەم لەکاتی کۆخە، کۆخەی تەڕ.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

لە کاتی برینی گەدە.

## 55) Bronquium elixir Theophylin Syrub:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ڕەبۆ، ڕەق بوونی بۆڕی هەوا، هەوکردنی بۆڕی هەوا.

- **بەکارناهێنرێت لە /**

نەخۆشی دڵ، لەگەڵ زانیتین.

.

.

.

# C

## 56) Calbocisteain - Mucodyne Cap:

• بەکاردەهێنرێت/

بۆ چارەسەرو لابردن و فرێدانی بەڵغەم و دەرداو لەبۆڕی هەناسە.

## 57) Carbamazepine-Tegretol Tab 100-200-400 Mg:

• بەکاردەهێنرێت/

بۆ سەرعی گەورەو سەرعی دەرونی جوڵەی کاتی، بۆ ڕانەوەستانی میز بەدوای یەك، بۆ ژانی کۆبوەوە، گەشکەی کاتی.

• بەکارناهێنرێت لە/

هەستیاری بەخۆی، نارێکی لە مۆخی ئێسك، لەگەڵ دەرمانی دژە خەمۆکی، نارێکی لە جگەرو کلیە، نەخۆشی کۆئەندامی دەمار.

## 58) Cansten Tab-Oint-Cream-Powder-Solution:

• بەکاردەهێنرێت/

بۆ هەوکردنی کەڕووی پێست (فطریات)، کەڕووی زێ.

59) Captocard-Captophen Tab 25-50 Mg:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ دابەزاندنی پاڵەپەستۆی خوێن، بۆ نەخۆشی دڵ.

- بەکارناهێنرێت لە/

زگ پڕی، تەسك بوونەوەی شاخوێن بەر.

60) Carbamide Peroxide Cetyl Pyridinium:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ خاوێنکردنەوەی ناو دەم.

61) Carboryl - Carylderm Lotion %0.5:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ ئەسپێی سەر عانەو بن هەنگڵ، کەم کردنەوەی تۆشکە هێلکەی ئەسپێ.

## 62) Carbimazole-Neomercazole Tab 5-10-20-40-60 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری زیادی چالاکی ڕژێنی دەرەقی، بۆ ئامادەکردن لەکاتی لابردنی دەرەقیو چارەسەری بەهۆی یۆدین.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

ناتەواوی هەرسو گەدە، زگ پڕی، شیرەخۆر، شیردەر.

## 63) Caster Oil Solution:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ قەبزییەکی کەموکورت، بۆ ئامادەکاری نەشتەرگەریو پشکنینی کۆمو ڕیخۆڵەکان، پێش وێنە گرتنی إیشاعی.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

قەبزی درێژخایەن، ئازاری سک، ڕشانەوەو هەڵێنج، هەوکردنی ڕیخۆڵەکوێرە، ناتەواوی قۆلۆن، خوێن بەربوونی کۆم.

## 64) Cefotaxime-Claforan Veal 500 Mg-1-2 M:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنەکانی بۆرییەکانی هەناسە، بۆری میز، کۆئەندامی دەمار، پێست، ئێسكو جومگەکان، ریخۆڵەکان، پەردەکانی دەماغ لەمنداڵانو گەنجەکان، بۆ قونێلی دەماغ (مێشك)، بۆ ژەهراوی بوونی بەکتریایی، بۆ خۆپاراستن پاش نەشتەرگەری.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

هەستیاری بەخۆی، لەگەڵ برونبسید، پەك کەوتنی کلیەکانو جگەر، ناتەواوی گەدە، کەم خوێنی.

## 65) Cetpar-Acetaminophillin+Coddine Tab 500 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ژانی سووكو مام ناوەند، ژانی ددان، سەر، لاسەر.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

سست بوونی جگەر، زگ پڕی، شیردەر، شوفێری، مەشروب خۆری.

## 66) Ceftriaxone Sodium Samixon Veal:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ بەکتریایی G+.G- هەوکردنەکانی بۆڕی هەناسە، میزڵدانو میزەڕۆ، سکۆڵەکان، ئێسک، جومگەکان، پێست، برین، شانەی لینی، زاوزێ، پەردەکانی مێشك، پاش نەشتەرگەری.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

هەستیاری بە سیفالوسبورینات، زگ پڕی بەتایبەت لە ٣ مانگی یەکەم، بوونی بیلروبینو ئەلبومین لەخوێن، شیرەخۆری ناکام، کەمی ڤیتامین کەی، نەخۆشی جگەر، بەدخۆراکی، نارێکی کلیەکان.

## 67) Chloral hydrate-Tricloryl Tab–Syrub:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ خەوداهێنان لەباری ئارەقەنەکردنو هەست کردن بەئازارێکی زۆر، کەم بەکاردێت چونکە مەترسی مردنی زۆرە.

## 68) Cephalexin Hydrochloride-Keflex Cap-Syrub-Veal 125-250-500 Mg:

- **بەكاردەهێنرێت/**

بۆ هەوكردنەكانی كۆئەندامی هەناسە، بۆری میزو میزەڕۆ، زاوزێ، ئێسك، پێست، جومگەكان، گوێی ناوەڕاست، ددان، سفلس، بۆ ئەوانەی هەستیاریان بەپەنسلین هەیە.

- **بەكارناهێنرێت لە/**

هەستیاری بەخۆی، نارێكی گەدە، كەم خوێنی، ناتەواوی كلیەو جگەر، خروشانی كۆئەندامی هەرس.

## 69) Charcoal Tab 125 Mg:

- **بەكاردەهێنرێت/**

بۆ ژەهراوی بوون بەهۆی زیادەی ڕێژەی هەندێك لە دەرمانەكان، ژەهراوی بوون بەهۆی ڕوەكی ژەهراوی.

- **بەكارناهێنرێت لە/**

ژەهراوی بوون بە ماددەی سوتێنەر.

70) Chloramphenicol Cap-Veal-Drop-Oint-Supp %1-2-4 ,150-250-500 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ گرانە تا (تایفوئید)، بارا تایفوئید، تای مالتا، هەوکردنی ریخۆلەکان، کۆخی کەلەبابی، هەوکردنی پەردەی دەماغ، هیمۆفیلس ئەنفلەوەنزا، هەوکردنی پێست کە هەستیاریش دروست بکات (حساسیە)، هەوکردنی پێشەوەی چاو سپێنەی چاو، هەوکردن و داخورانی چاو بەهۆی زیندەوەری وردبین.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

زگ پڕی، شیردەر، شیرەخۆر، منداڵ، هەوکردن و نەخۆشی جگەر، هەستیاری بەخۆی، هەوکردن و ناتەواوی گەدە، کەم خوێنی، هەوکردنی جگەر و کلیەکان، نارێکی مۆخی ئێسك، نارێکی و نەخۆشیەکانی خوێن.

71) Cisplation Veal 1 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ شێرپەنجەی سەر، مل، ئێسك، گونەکان، هێلکەدان، ڕەحم، میزەڕۆ.

72) Chloraquine Tab-Ampul 50-250-500 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ تووش بوون بە مەلاریای توند بەهۆی (پلاسمودیوم فیراکس، ڤالسپرام، ئۆڤال، مەلاریا)، بۆ خۆپاراستن لەو شوێنانەی مەلاریایان زۆرە.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

هەستیاری بەخۆی، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، ناتەواوی توندی گەدە، کەم خوێنی نارێکیەکانی توندی خوێن، بەردەوام بوون بە مەشروبات.

73) Chloropramazine- Largactil Tab 10-25-50-100 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ رشانەوە بەتایبەت لەئافرەتی سک پڕ هێمن کەرەوەیە، بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی، شزروفینیا.

74) Chlorothiazide-Diurel Tab-Syrub-Ampul 250-500 Mg:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ بەرزبوونەوەی زەخت پاڵەپەستۆی خوێن، ئاوتێزان، مدرر میزکردن.

- بەکارناهێنرێت لە/

هەستیاری بەخۆی، نارێکی کۆئەندامی هەرس، بەوریایی لە نەخۆشی جگەرو کلیە، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن.

75) Cinnarzine Tab:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ چارەسەری ڕەق بوونی مولولەکانی خوێنی دەماغ، بۆ سەر سووڕانو تێك چوون لەسەفەردا، لەکاتی تێك چوونی فەرعی دەمیلزی.

## 76) Chlorphenarmine Allermin Tab-Syrub-Ampul-Cap 4-6-8-10-12 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەستیاری بەتایبەتی مێشولەو ئاژەڵو کشتوکاڵیو دەرمانو...هتد، لەکاتی گیرانی مولولەی توندی کەپوو، بەرزبونەوەی پلەی گەرما، هەستیاری بەهۆی گواستنەوەی خوێن.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

بە وریایی لەگەڵ گاریگەریەکانی کۆئەندامی دەمار، لەگەڵ ئینهابیتۆرس، بە وریایی لە نەخۆشی کلیە، بەرزی پاڵەپەستۆی خوێن، ڕەبۆ، گیرانی میز، پرۆستات، برینی گەدەو دوانزەگرێ، لێخوڕینی ئۆتۆمبێل، ئیشی گەورە، گلوکۆما، بێ هۆشی.

## 77) Chorambucil-Lukeran Tab 2-5 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری نەخۆشی خوێنی سپی، غوددەی دەرەقی، شێرپەنجەی هێلکەدان.

## 78) Chlorpromazine-Largactel Tab-Cap-Ampul-Syrub-Supp:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هێمن کەرەوەی دەرونی، بۆ ڕشانەوە بۆ ئافرەتی سك پڕ، خوران، گرژبون تشنوجات، بۆتوندی قەلەقیو هەڵچون، جوڵەی خۆنەویست، ناڕێکی ڕەوشتی منداڵ، بەرز بونەوەی پلەی گەرمی.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

بەوریایی لەگەڵ دەرمانی دژە کۆئەندامی دەمار، نەخۆشی جگەرو کلیەکان، کۆئەندامی هەناسە، دابەزینی شەکرە، منداڵ، بێ هۆشی.

## 79) Chorodiazopoxid-Librax Cap 2.5 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ژانی زگ، گەدە، هەوکردنو برینی گەدە، بەد هەرسی، گرژبوونی قۆلۆن.

## 80) Cimetidine-Tagamet Tab-Syrub-Ampul 100-200-300-400-800 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ (قرحـە) برینـی گـەدەو دوانزەگـریّو سوریّنـچكو نـاودەم، بـۆ پارێزگاری کردن لـە گەڕانـەوەی خـواردن لەگـەدەوە بـۆ سوریّنـچك (هەڵێنج)، چارەسەری خوێن بەر بوونی گەدەو سوریّنـچك، بـۆ ژانـی سەرگەدە، بۆ هەوکردنی پەنکریاس، بـەکاردێت پـێش نەشـتەرگەری بـۆ کـەم کردنـەوەی مـاددەی ترشـەڵۆك، کـەم کردنـەوەی دەرداوی ترشی، پەك کەوتنی جگـەرو کلیـەکانو بەرکـەوتنی هێزێکـی تونـدی دەرەکی.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

جگەرە کێشان دەبێتـە هـۆی زیـادەی ترشـیو دەرداو لەگـەدە، بـە وریایی لە زگ پڕی، شیردەر، منداڵ، ناتەواوی کلیەکان.

## 81) Clarithromycin-Claribac Syrub:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنەکانی گەروو، ئاڵوەکان، بۆڕی هەوا، پێست لـە منـداڵان، گوێی ناوەڕاست، بۆ برینی گەدەو ڕیخۆڵە.

## 82) Ciprofloxiacin-Ciprodar Tab-Ampul 200-250-400-500-750 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنەکانی بۆری میزو زاوزێ، ئێسك، جومگەکان، بۆری هەناسەو سنگ، پێست، ژەهراوی بوونی خۆراکی، تای تایفوئیدی (گرانەتا)، سیلان، سگ چوون، سیلی سی.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

زگ پڕی، مندالّ، شوفێری، ناتەواوی کلیەکان، هەستیاری بەخۆی، ناتەواوی گەدەو زگ، ئازاری پشتو جومگەکان.

## 83) Clafibrate-Atromide_S Cap 500 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ زیادبوونی ڕێژەی پرۆتین لەخوێن.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

نەخۆشیەکانی زەرداو، گورچیلە، جگەر.

## 84) Cisapride-Vomipide Tab 10 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری شەلەلی گەدە کەهۆیەکەی نەزانراوبێت، گیرانی گەدە، زیادکردنی جوولەی ریخۆڵەکان، قەبزی، کەم توانایی هەرس کردن، بۆ برینی سەر گەدە، بۆ گەورە بوونی سك، چارەسەری زوو برسی بوون، رێك خستنی گەڕانەوەی خۆراك لەگەدەوە بۆ سورێنچك کەدەبێتە هۆی مردن لەکاتی نەشتەرگەری‌و بەنج کردن.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

کاتی زۆری لێدانی دڵ، بەرزی پاڵەپەستۆی خوین.

## 85) Clobetasole Oint % 5:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردن، هەستیاری پێست، ئەکزیما، خرووشی پێست.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

نەخۆشی ڤایرۆسی، میکوتە، کاندیدا ئەلبیکانس، هەستیاری بەخۆی.

## 86) Cisspride - Vomipride Syrub:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ شەلەلی گەدە کەهۆیەکەی نەزانراو بێت، گیرانی گەدەی ناڕاست، زیادکردنی جوڵەی ڕیخۆڵەکان، قەبزی، کەم توانایی هەرسکردن، برینی سەر گەدە (الم الشرسوف)، گەورەبوونی سک، چارەسەری زووبرسی بوون، ڕێکخستنی گەڕانەوەی خۆراك لەسورێنچك کەدەبێتەهۆی مردن، لەکاتی نەشتەرگەریو بەنج کردن.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

کاتی زیادی لێدانی دڵ ، پاڵەپەستۆی خوێن.

## 87) Clomifranil-Anafrinal Tab 10-25 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری خەمۆکیو قەلەقی، ترسان، ژانی دووبارە بووی درێژخایەن.

## 88) Citro_term Trimethoprim +Sulphamixazole Syrub 100-120 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنەکانی بۆڕی هەناسە، ئالوەکان، سەرەوەی دەم، تـووش بوون بە بەکتریا لەکۆئەندامی میز، گـەدە، ڕیخۆڵـە، پێـست، زیپکـە، برینداربوون.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

لە منداڵی کەمتر لە ٣ ساڵ، سگ پڕی، نەخۆشی گورچیلە.

## 89) Clomiphene-Clomid Tab 50 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری نەزۆکی، لەباری دەرنەچوونی هێلکە لە هێلکـەدان لـە ئافرەتان، جوڵێنەری ڕژێنە سێکسیەکان.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

هەستیاری بەخۆی، زگ پڕی، کیـسی سـپی، نەخۆشـیەکانی جگـەر، ناتەواوی بینین، ناتەواوی گەدە، شوفێری، ئیشی گەورە.

## 90) Clemostine-Tavagyl Tab-Syrub-Ampul 0.1-1 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ بەرزبونەوەی بەهێزی پلەی گەرمی، هەستیاری، ئەکزیما، شریء، دژە هەستیاری بەدەرمان، خوران بەهۆی ئەکزیمای توندودرێژ، ئەو هەستیاریانەی کە بەهۆی زەردەواڵە (حشرات) دروست دەبێت، هەستیاری گواستراوەی خوێن، کەم کردنەوەی دەرداوی ترشەڵۆکی گەدە، بۆبرینی گەدەو سوتانەوەی.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، خێرایی لێدانی دڵ، ڕشانەوە، بەوریایی لە تەمەنی ١٢ ساڵ کەمتر.

## 91) Clotrimazole Oint-Drop-Supp:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری قلیشانی پێو لەش، ڕێگەگرتن لەچوونەژوورەوەی ئەنگلستۆما، کەڕووی ناو پەنجەی پێ، هەوکردنی منداڵدان (رحم).

## 92) Cloxacillin:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردن بەهۆی ستافیلۆکۆکەس، هەکردنەکانی قورگ، گەروو، ئاڵوەکان، بۆری میز، میزڵدان، ریخۆڵەکان، زەرداو، چاو، بۆ برین.

## 93) Cloxacillin Prostoplullin Cap – ing:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردن هەکردنەکانی قورگ، گەروو، ئاڵووەکان، بۆری میز، میزڵدان، ریخۆڵەکان، زەرداو، چاو، بۆ برین، هەوکردن بەهۆی ستافیلۆکۆکەس کە بەرگریان بە بەنزایل پەنسلین هەبێت.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

بوونی هەستیاری بە پەنسلین.

## 94) Co Trimoxazole-Sulphamethazole-Tripmethoprim Tab-Syrub 120-240-480 Mg:

• بەکاردەهێنرێت/

بۆ هەوکردنەکانی کۆئەندامی هەناسە، کۆئەندامی میز، زاوزێ، هەناسە، پێست، گەدە، ڕیخۆڵەکان، ژەهراوی بوونی خوێن، گرانەتا، کۆنوریا گوێ، زەحیری چیلکەیی، سووزەنەك.

• بەکارناهێنرێت لە/

زگ پڕی، شیردەر، هەستیاری، ناتەواوی کۆئەندامی هەرس، زگ ئێشە، منداڵی تەمەن کەمتر لە ٢ مانگ.

## 95) Codeine Phosphate - Methyl Morphine Tab-Syrub 15-30-60 Mg:

• بەکاردەهێنرێت/

بۆ کۆخی ووشك، بۆ ئازار شکێنی مام ناوەندو سووك.

• بەکارناهێنرێت لە/

هەستیاری بەخۆی، برینی سەر، نەخۆشی جگەرو گورچیلە.

## 96) Colchicine Tab - Ampul 0.5-0.6-1-2 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ئازارشکێنی لەش، بۆ ژانی لەرزۆکیو لەرزۆکی توند، لەرزۆکی بێزارکەر.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

لەگەڵ إیثانولو ڤیتامین B12، ڕشانەوە.

## 97) Cortamiton - Pruex Oint:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ خوران بەهۆی پێوەدان، برینی قووڵ، هەوکردنو هەستیاری پێست، ئەسپێی سەر میزڵدان، کەڕوو، گروویەتی (داو الجرب).

- **بەکارناهێنرێت لە/**

برینی گەورە، سەر پێڵووی چاو، سەرو پرچ، زۆری بەکارهێنانی.

## 98) Cyklocapron Tab - Ampul 250-500 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ڕاگرتنی خوێن بەربوونێکی بەهێز، خوێن بەربوونی دوای منداڵ بوون.

## 99) Cyproheptadine - Preictin Tab -Syrub 2-4 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەستیاری، میگەرین، سەر ئێشە، گەڕانەوەو باش کردنی خواردنو ئارەزووکردنی، بۆ خورانی کۆئەندامی زاوزێ.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

ڕەبۆ، گیرانی دەرچەی دوانزەگرێ، ناڕێکی کۆئەندامی هەرس، بەرزی پاڵەپەستۆی خوێن، لێخوڕینی ئۆتۆمبێل، مەشروب خۆری، بە وریایی لەگەڵ قاوەو چا سەر سوڕان زیاد دەکات، بنێشتو آیس کریم.

# D

## 100) Daanorabicin Ampul +Veal 30 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ شێرپەنجەی لۆکیمیای توند.

## 101) Deazepam –Valium Tab–Cap–Ampul 10 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ گەشکە، نۆرەی پەرکەم لەگەورەدا، بۆ هێمن کەرەوەی دەرونی، چارەسەری ڕەق بوونی ماسولکە، خەوداهێنان، دڵەڕاوکێ.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

بێ هەستی بێ هۆشی، شۆك، بەردەوام بوون بە مەشروبات (مدمن)، منداڵی تەمەن لە ٦ مانگ کەمتر، زگ پڕی بەتایبەت مانگەکانی سەرەتاو دوایی.

## 102) Demethecone Tab-Drop:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری‌و نەهێشتنی غازات لە کۆئەندامی هەرس.

## 103) Declofenac Sodium Voltarin Tab -Ampul-Supp-Oint-Drop 12.5-25-50-75-100 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنی ڕۆماتیزمی‌و جومگەکان، ژانی لەش، ژانی پشت، هەوکردنی زمان، ئازار شکێن پاش نەشتەرگەری، ئازاری بڕبڕە، بۆنەخۆشی لەرزۆکی، ئازاری ماسولکە، نەخۆشیەکانی ئافرەتان، ژان‌و هەوکردنی چاو.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

نەخۆشی دڵ، بەرزی پاڵپەستۆی خوێنی، برینی گەدەو دوانزەگرێ، نارێکی چالاکی کلیەکان، نارێکی جگەر، زگ پڕی، مندالّ.

## 104) Dephenoxlate HCL Atropen–Lomotil Tab:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری سگ چوون.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

کاتی تێکچوونی جگەر.

## 105) Dermsalic–Betamethasone+Salsalic Acid Oint:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنی پێست، ئەکزیما، هەوکردنی ژێر پێست.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

حب شباب، برین، بۆگەن بوونی پێست بەهۆی ڤایرۆسی فطري، طفيلي.

## 106) Dextomethorphan - Sedlar Tab-Drop 15 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ڕاگرتنو ئازاری کۆخ.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، بێ هۆشی، هەستیاری بە ئەسپیرین، نەشتەرگەری سینگ.

## 107) Dexamethasone-Decadrone–Dexon Tab-Syrub-Ampul:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بـــۆ ئـــاوتێزانی مێـــشك، ڕۆمـــاتیزمی، بارەکـــانی هـــەوکردن، هەستیارییەکان، شۆك، دروست بوونی گرێی سەرەتایی، نەخۆشـیو ژانـی ماسـولکەکان، گرژبـوونو ژانـی لـەش، هـەوکردنی سـینگ، هەوکردنی بۆری هەوا، ڕەبۆ.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

بۆماوی درێژ، بەرزی پاڵەپەستۆی خوێن، ناتەواوی بینین، ناتـەواوی سوری مانگانە، برینـی گـەدە، کـەم خـوێنی، خروشـانی کۆئەنـدامی هەرس، لەگەڵ بریدنیزولون، سەر سوڕانو ئێشی سەر.

## 108) Diamecron - Gliclazide Tab:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرە، بۆ نەهێشتنی ڕودانی خوێن مەین.

## 109) Diane - Cyproterone Acetate +Ethinyleostradiol Tab:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ رێگەگرتن لەسک پڕی.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

شیرپەنجەی مەمك، پەك کەوتنی جگەر، زەرتـك، شـیرپەنجەی زێ، نەخۆشی کۆئەندامی سوڕان، ڕەبۆ، گەشکە.

## 110) Diazoxid ing 30 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ کەم بوونی ڕێژەی شەکر (ئەنسۆلین).

## 111) Dicafinon Vial 25-50 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ دروستکردنی ئەوشوێنەی کە لە لەش تێك چووە بەتایبـەت پـاش نەشتەرگەری.

112) Dicyclomine Hydrochloride - Anti Spasmin Tab-Cab-Syrub-Ampul-Drop 2-10-20-50 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ نارێکی وەرەزکەری ریخۆڵەکان، سوتانەوەو ئازاری گەدە، برینی دوانزەگری، ژانو هەوکردنی مراره، ژانی ریرەوی میز، ناباشی سوری مانگانە، بۆ نەهێشتنی غازات بەتایبەتی لەمندالان.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

گیرانی کەنالەکانی کۆئەندامی هەرس، برینی گەورە، خوێن بەربوونی توند، لەگەڵ هستامین، دژه بارکنسون، کوینەدین، کەمی رژێنی دەرەقی، نەخۆشی شاخوێن بەر، پەك کەوتنی دڵ، بەرزی پاڵەپەستۆی خوێن، نەخۆشی جگەرو کلیە، لێخورینی ئۆتۆمبێل، ئیشی گەورە، رەبۆ.

113) Diethylpropin - Apisate Tab:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری قەڵەوی.

## 114) Difemenine HCL Cap 2.5 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ گرژبوونی گەدەو ریخۆڵەکان، تورەگەی زراو.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

تەسك بوونی نێوان گەدەو ریخۆڵە، پەستانی چاو.

## 115) Digoxin Tab-Cap-Syrub-Ampul-Supp 0.5-0.1-0.2-0.25-0.125 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری گرژبوونی گوێچکەڵەی دڵ، پاش نەشتەرگەری دڵ، سنگە کوژێی توند، پەك کەوتنی دڵ، خێرای لێدانەکانی دڵ، کەم کردنەوەی پاڵەپەستۆ لەسەر دەمارەکان، بەهێزکردنی ماسولکەو رێك خستنی لێدانەکانی دڵ، وشك بونەوەو نارێکی سکۆڵەکان.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

هەستیاری بەخۆی، خاو بوونەوەی ماسولکەکانی توندی دڵ، کەمی لێدانەکانی دڵ، نەخۆشی بەهێزی سییەکان.

## 116) Dihydroergolamin - Seglor Cap 1.5 Mg:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ چارەسەری میگەرین (شەقیقە) بەکاردێت.

- بەکارناهێنرێت لە/

شۆك، نەخۆشی خوێن بەری کلیەکان، بەرزی پەستان.

## 117) Dikazol Cream:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ ئەکزیما.

## 118) Dimedrol Oint-Cream:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ هەوکردنو هەستیاری پێست.

## 119) Doxorubicin -Adriblastina Veal 10 Mg:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ شێرپەنجەی خوێن، لۆکیمیا، لیمۆفیا، نەخۆشیە ترسناکەکانی تر

## 120) Diltazem Tab-Cap-Ampul 30-60-90-120-180-240-300 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ سنگە کوژێ، سنگەکوژێی بەردەوامو درێژخایەن، بەرزبوونەوەی زەخت.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، نارێکی لە ماسولکەو چالاکی دڵ، ناتەواوی سییەکان، بەکارنایەت لەگەڵ سایکلوسبورینو دیجوکسین.

## 121) Diphenoxylate HCL Atropine Sulfate Entrostop - Lomotil Tab-Syrub 2.5-20.5 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ زگ چوونی توندی بێ جۆرو هۆ.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

زگ چوون بەهۆی ژەهراوی بوونو بەکتریاو دژە ژیانەکان، منداڵی کەمتر لە ٢ ساڵ، نەخۆشی زەرتك، لەگەڵ مۆرفینو للوموتیل، هەوکردنی جگەر، قۆلۆن، شوفێری.

## 122) Dopamine Ampul 40-80-160 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ کۆنترۆڵ کردنو بەرزکردنەوەی زەخت (پاڵەپەستۆی خوێن) لەکارکەوتنی دڵ، شۆکی دڵ، بۆ نەزیفی دڵ، چاك کردنەوەی هاوسەنگی میکانیکی.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

بەرزی پاڵەپەستۆی خوێن، خێرای لێدانەکانی دڵ، ووشك بوونەوەی سکۆڵەکان، لەگەڵ أرکوتو غازە هەڵمژەرەکان، بە وریایی لەگەڵ نەخۆشی مولولەخوێنەکان، برینی شەکرە.

## 123) Dytide -Treametrene+Benthiazide Cap:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری هەڵئاوسان (ئۆدیما)، بەمۆم بوونی جگەر، پەك کەتنی دڵ، نەخۆشیە نیفرۆنەکانی گورچیلە.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

زگ پڕی بەوریایی، نەخۆشی گورچیلە.

# E

## 124) Econazol Cream-Powder-Spray-Solution:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ کەڕووی پێست.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

چاو.

## 125) Ephedrine Hydrochloride Tab-Ampul-Drop %2-30 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ تەنگەنەفەسی، ڕەبۆ، بۆ چارەسەری پۆشەتا، بۆهەلامەتی توونـد، هەوکردنی توندی کەپوو جیوب، لەگەڵ مادده هەستیارەکان دەبێتە هۆی بڵندبوونی زەخت.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

شۆك، تراخۆما، فراوان بوونی دڵ، بەنجی گشتی، ناتەواوی مێشك.

## 126) Eskamel -Tinted+Sulph+Resorcinol:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ زیپکەی ڕوخسار.

## 127) Erythromycin Tab-Cap-Syrub-Veal-Powder-Oint 125-250-500 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ دەردەکۆپـان، کـۆخی کەڵـەبابی، سـیلان، نەخۆشـی فـەرەنگی (زهـری)، ئەنفلـەوەنزا، هـەوکردنی (قـصبات) ڕێـچکەو بۆڕیـەکانی هەناسە، هەوکردنی پەردەکانی ژێرمێشك، هەوکردنەکانی لەوزەتێن، ئێسك، جومگە، گوێی ناوەڕاست، پێست، ژانەسك.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

هەستیاری بەخۆی، نەخۆشی جگەر، ژەمی بەرز دەبێتە هۆی کـەڕی گویَ بۆماوەیەك، نانەواوی گەدە، لەگـەڵ ئیرگۆتـامین، ئـەمینۆفیلین بەتایبەت لەمنداڵان، هەوکردنو نەخۆشی جگەر، ناتەواوی گەدە،زگ پڕی، منداڵی بچووك.

## 128) Estrogen Ampul:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ نیشانەکانی نەمانی بێ نوێژی ئاسایی، بۆدرەنگ بالغ بوونی کچان، کەم دیتن‌و نارێکی بێ نوێژی، بۆ خوێن بەربوونی ڕەحم، ئازاری زۆر لەکاتی بێ نوێژی، نەزۆکی، ساردی سێکسی لە ئافرەتان.

## 129) Eugynon -Ethinyleostradiol+Norgestral Tab:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ڕێگەگرتن لەسک پڕی.

- **بەکارناهێنرێت لە /**

شێرپەنجەی مەمك، پەك کەوتنی جگەر، زەرتك، شێرپەنجەی زێ، نەخۆشی کۆئەندامی سوڕان، ڕەبۆ، گەشکە.

## 130) Etoposide Cap + Ampul 100 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ شێرپەنجەی سییەکان، گونەکان، نەخۆشیەکانی ئایدز.

## 131) Ethambutal Tab 100-400 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ کوشتنی بەکتریا، چارەسەری سیلی سییەکان.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

منداڵی تەمەن لە ١٣ ساڵ کەمتر، هەوکردنی دەماری بینینو تۆڕی چاو، ناتەواوی گەدە، نەخۆشیەکانی کلیە، ئاوی ڕەشی چاو.

.

.

.

# F

## 132) Famotidine - Amodin Tab:

### • بەکاردەهێنرێت/

بۆ برینی دوانزەگرێو پارێزگاری کردن، چارەسەری کورت بۆ برینی گەدە، بەکاردێت لەکاتی ئەستور بوونی کوێرە ڕژێنەکان(غدد الصماء )، چارەسەری خوێن بەربوون لەخوارەوەی کۆئەندامی هەرس: مستقیم، قۆلۆن، کۆم، بۆ پارێزگاری (ژات الرئه) بەهۆی ترشەڵۆکی گەدەوە دروست دەبێ.

## 133) Fenistil - Dimethinden Maleate Tab-Syrub-Drop 1-2.5 Mg:

### • بەکاردەهێنرێت/

بۆ خوران، هەستیاری پێستو هەستیاری کۆئەندامی هەناسە.

### • بەکارناهێنرێت لە /

لێخوڕینی ئۆتۆمبێل، لەگەڵ دەرمانی هێمن کەرەوەی کۆئەندامی دەمار، نارێکی کۆئەندامی هەرس، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، بێ هێزی ماسولکەکان.

## 134) Flu Out-Paracetamol+Chloramphiniramine +Vitamin C Tab 500 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ لابردنی گیرانی کەپوو گەروو، بۆچارەسەری پەستیو هەڵامەتو ژانەسەر بەتایبەتی لەوەرزی سەرمادا.

## 135) Flumethasone Pivalate –Locacorten Oint-Cream-Solution %0.02:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ نەخۆشی صدفی، ئەکزیما، هەستیاری درێژخایەن.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

برین، هەوکردنی ڤایرۆسی.

## 136) Folic Acid Tab 1-5 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ کەم خوێنی بەهۆی کەمی رێژەی فۆلیك ئەسید لەخوێن، بەدخۆراکی، مەلاریای چەند بارەبوو، کرم.

## 137) Fluocinolone Acetonid-Proctoheal_Oint-Supp:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ مایەسیری ناوەوەو دەرەوە، ئەکزیمای کۆم، هەوکردنی کۆم، خورانی کۆم، پاش نەشتەرگەری مایەسیری.

- بەکارناهێنرێت لە /

کاتی سیل زوهری (فەرەنگی).

## 138) Forvital - Vitamin E Tab:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ چارەسەری کەمی ئەم ڤیتامینە، بۆ نەخۆشی ماسولکەکان، کەم خوێنی، هەوکردنەکانی زەرداو، جگەر، پەنکریاس، نەخۆشی ریخۆلەکان، نارێکی رێژەی کۆلیسترۆڵ.

## 139) Fucidin - Uciderm Cream:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ نەخۆشی پێست ئەوەی لەئاژەڵو تەیروتاڵ دروست دەبێت.

## 140) Furosemide -Lasix Tab-Ampul-Solution 10-20-40-80 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ئاوسان بەهۆی نەخۆشی گورچیلە، سست بوونی دڵ، بەمۆم بوون‌و سست بوونی جگەرو بەرزبونەوەی سەختی پاڵەپەستۆی خوێن، بۆ ئاوتێزانی سییەکان، بۆ ناتەواوی گورچیلەکان بۆ ئۆدیما بەهۆی سوتان، بۆچارەسەری کەم میزکردن.

- **بەکارناهێنرێت لە /**

هەستیاری بەخۆی، دابەزین‌و رێکی پاڵەپەستۆی خوێن، لەگەڵ کۆرتیزۆنات دەبێتەهۆی دابەزینی شەکر لەخوێن، دەبێتە هۆی ژەهراوی بوون لەگەڵ دیجتالیس، نەخۆشی جگەر، ووشك بوونی لەش، لەگەڵ سیفالۆکسین.

## 141) Furoxone Furazoliden Tab:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری سگ چوون لەو کاتەی کە کرمی ئەسکارس دەبێتە هۆی زگ چوونەکە.

## 142) Fusign-Tendazole Tab 500 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

**بۆ چارەسەری سک چوونو ژانەسک بەهۆی جیاردیاو ئەمیبا، هەوکردنی جگەر بەهۆی ئەمیبا، بۆ هەستیاری کۆئەندامی زاوزێو زێ.**

# G

## 143) Gama Benzene Hexachlor Solution:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ گرێوویەتی (داء الجرب) ٢٤ کاتژمێر.

## 144) Gastrogel - Al_Hcl Tab:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ چارەسەری کەم کردنەوەی ترشەڵۆکی گەدە، برینی گەدە.

## 145) Gastrozepin - Perenzepine Tab:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ برینی گەدەو دوانزەگرێ، بۆ نەهێشتنی گەڕانەوەی خواردن لەگەدەوە بۆ سورێنچك.

## 146) Gaviscon-Algiril Acid+Magnisum +Allumnium+Sodium Bicarbonate Tab:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ سووتانەوەو ژانی گەدە، بۆ زیاد بوونی ترشەڵۆکی گەدە، برینی گەدە.

## 147) Guinidine Tab-Cap-Ampul 200-300 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ووشک بوونەوەی سکۆڵەکانی دڵو خەفەقان، ڕێک خستنی لێدانەکانی دڵ، بەرزبونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن، بۆ نەخۆشی مەلاریا لە جۆری P.F

- **بەکارناهێنرێت لە /**

هەستیاری بەخۆی، ناچالاکی دڵ دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، ناتەواوی کۆئەندامی هەرس، ڕەبۆ، بەرزی پلەی گەرمی.

## 148) Glibenclamide-Daonil Tab-1.25-2.5-5 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ دابەزاندنو کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشی شەکرەی باوەڕ پێنەکراو لەسەر ئەنسۆلین، لەکاتی نەخۆشی شەکرەی سووک.

- **بەکارناهێنرێت لە /**

بەرزی توندی شەکرە، زگ پڕی، شیردەر، ناتەواوی گەدە، نەخۆشی کلیەو جگەر، زەرتك.

## 149) Gentamicin-Garamycin Ampul-Oint-Cream-Drop 20-40-80 Mg:

### • بەکاردەهێنرێت/

بۆ هەوکردنەکانی کۆئەندامی میزو میزلدانو گورچیلە، کۆئەندامی هەناسە، کۆئەندامی هەرس لەئەنجامی حمی تایفوئید (گرانەتا)و باراتایفوئید، پەردەکانی دەماغ، گوێی ناوەڕاست، شانەکانی پێست، چاو، لووت، گویێ، ددان، پاش نەشتەرگەری بۆ هەوکردنەکانی بۆڕی میزو کۆئەندامی هەرس، پاش شوشتنی کلیەکان لەڕێگەی خوێن، ژەهراوی بوونی بەکتریایی، سیلان، بۆ سووتان.

### • بەکارناهێنرێت لە/

زگ پڕی، شیرەخۆر، شیر دەر، ناتەواوی‌و نەخۆشیەکانی کلیەو گورچیلە، شوشتنی کلیە لەڕێگای خوێن، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، کەم خوێنی، ناتەواوی گەدە، تا هەستیاری بەخۆی، لەگەڵ کلافۆران لازیکس.

150) Glucagon Veal 1-10 Mg:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ بەرز کردنەوی ڕێژەی شەکر، توش بوون بە بورانەوە لەکاتی کەمی ڕێژەی شەکر، بۆ چارەسەری شۆکی ئەنسۆلین.

- بەکارناهێنرێت لە/

هەستیاری بەخۆی، ناتەواوی گەدە، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، لەگەڵ فینتون، دابەزینی شەکرە.

151) Glymidine - Glycodiozine Tab 0.5-1 G:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ دابەزاندنو هاوسەنگ کردنی هەموو جۆرەکانی خۆشی شەکرەو بۆهەموو تەمەنەکان.

- بەکارناهێنرێت لە/

نارێکی گەدەو ڕیخۆڵەکان، هەستیاری، قەڵەوی.

152) Guanitthidine-Ismelin Tab 25-50 Mg:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ چارەسەرکردنی پەستانی خوێن.

# H

## 153) Haloperidol-Serenace Tab 1-5 Mg:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ نەخۆشی دەروونی: شیزۆفینیا، شێتی، تێك چوونی دەروونی.

## 154) Halothane Oint:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ سڕکردن بەهۆی هەڵمژینەوە لەسەر شوێنەکە دادەنرێت.

- بەکارناهێنرێت لە/

بەرزی پەستانو مام ناوەندی، نەخۆشی جگەر.

## 155) Hamokion-Vitamin K Ampul:

- بەکاردەهێنرێت/

بۆ چارەسەری کەمی ڕژێنی پرۆثرۆمبین، نەخۆشی زەرداو، جگەر، بۆخوێن بەربوون، خوێن بەربوونی کاتی لەکاتی منداڵ بوون.

156) Hemol-Hydrocortesone+Benzyl Veal:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ڕۆماتیزم، نەخۆشی پێست، هەستیاری، ڕەبۆ، تەنگەنەفەسی، سیرەم، تای بەرز، هەوکردن و برینی گەدە، هەوکردنی ڕیخۆڵەکان، هەوکردنی گورچیلە، چارەسەری کەم خوێنی بەهۆی شیبونەوەی R.B.C، بۆ کۆئەندامی دەمار هێمن کەرەوە.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

لە کاتی میرکوتە (جدر ماء).

157) Histalix -Diphan Hydramine +Amounium Chloride+Sodium Citrate+Meuthol Syrub:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ کۆخە، گیرانی لووت، گیرانی بۆڕی هەوا.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

لێخوڕینی ئۆتۆمبێل، ئیشی گەورە، خواردنی دەرمانی هێمن کەرەوەو کۆئەندامی دەمار، ئارەق و حەبی خەمۆکی.

## 158) Heparin Ampul-Veal-Gel Mg & Iu:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ خوێن مەینی قوڵی خوێن هێنەرەکان، بۆ نەشتەرگەری دڵی کراوە، بۆ پاراستن لە جەڵتەو تەسك بوونەوەی خوێن هێنەرەکان پاش نەشتەرگەری، تەسك بوونەوەی سییەکان، بۆ نەمەینی خوێن لەکاتی نەشتەرگەریو گواستنەوەی خوێنو شوشتنی کلیەکان لەرێگای خوێن، چارەسەری گیرانی شان خوێن بەر، سور بوونەوەی موولوولەکان، برینداربوون، سووتان، پاڵەپەستۆ بەهۆی هێزێکی دەرەکی.

- **بەکارناهێنرێت لە /**

لەگەڵ دەرمانەکانی دژە خوێن بەربوون، نەخۆشی جگەرو کلیەکان، بەردەوام بوون بەمەشروبات، برین، ڕەبۆ، لەگەڵ ئەسپیرینو سالسیلات.

## 159) Humoxal-Benzododecinum Brom+Phenyl Phrien Drop:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ جیوبی توندی کەپوو، هەوکردنی گوێی ناوەوە.

160) Hydrocortisone  Tab-Veal- Ampul-Drop-Solution-Oint-Cream-Lotion  5-10-20-25-100-250-500 Mg- %0.0.25-1-2.5:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ هەوکردنە بەهێزەکان، کەمی ئەدرینالین، شۆك (صدمە)، ناڕێکی سییەکان، نەخۆشیەکانی پێست، هەستیارییەکان، نەخۆشیەکانی چاو، نەخۆشیەگواستراوەکان، لەکاتی ئاودزیوون، هەوکردنی پێست سووربوونەوە، خوران، ئەکزیما، قلیشان، خورانی کۆم، هەوکردنی چاو، ئەستوربوونی چاو.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

زگ پڕی، شیرەخۆر، میکوتە، ڤایرۆسی چاو، تووش بوون بەنەخۆشیەکانی کەڕوو، مندالّی ناکام، بەرزی پالّەپەستۆی خوێن، گرێ، برین و ناتەواوی گەدەو دوانزەگرێ، خروشانی کۆئەندامی هەرس، بێ هێزی ماسولکەکان، قۆلۆن، زیپکە، کەمی ڕژێنی دەرەقی، بەمۆم بوونی جگەر.

## 161) Hydroquinion - Philaquin Cream:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ پەڵەو بۆیەی ڕوخسار کەبەهۆی زۆری میلانین‌و زگ پڕی‌و حەبی دژە زگ پڕی دروست دەبێت.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

چوونە بەر تیشکی خۆر.

.
.
.

# I

## 162) Ibuprofen Tab-Syrub-Gel 100-200-300-400-600 Mg- %5:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ ئازارو سوتانەوەی جومگەکان، ژانی ئێسك، ئازارو گرژبوونی ماسولکەکان، تا ددان ئێشە، سەر ئێشە، میگەرین، ڕۆماتیزمی، هەوکردنو ئەستور بوونو بریندار بوونی پێست، زیپکە.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

برینو کوڵکی گەدەو دوانزەگرێ، خوێن بەربوونی گەدە، ڕشانەوە، ڕەبۆ، سووربونەوەی لووتی، سست بوونی گورچیلەو جگەر، منداڵ، زگ پڕی، شیردەر، لەگەڵ ئەسپیرینو ئەندۆمیتاسینو پێکهاتەکانی.

## 163) Indanazoline Hcl-Farial Drop:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ گیرانی لووت.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

گلۆکۆما.

## 164) Imipramine-Tofranil Tab-Ampul 12.5 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ خەمۆکی، میزی بەدوای یەك بەتایبەت لەلای منداڵان، هێمن کەرەوە، بۆنەهێشتنی ترسی شەوانە.

- **بەکارناهێنرێت لە/**

زگ پڕی، لێخوڕینی ئۆتۆمبێل، مەشروب خۆر، خاوی ماسولکەکانی دڵ، بەرزی پاڵەپەستۆی خوێن، لەگەڵ دەرمانی خەوداهێنان، تراخۆما، نارێکی جگەرو کلیە، لەکاتی چارەسەری ڕژێنی دەرەقی، ناتەواوی کۆئەندامی هەرس.

## 165) Intropin-Dopamin Ampul 40 Mg:

- **بەکاردەهێنرێت/**

بۆ وەستانی دڵ، شۆکی دڵ، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن ٥٠-٦٠ملگم/ جیوە لەناو مغزی.

